# ئامۆژگاری زێڕین بۆ ئافرەتان

نووسینی : بێدەنگی ئومەتەکەم

کتێبخانەی مسلم



[ إن الحمد لله، نحمَده ونستعينه، من يهده الله فلا مضل له، ومن يُضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدًاﷺ عبده ورسوله : اما بعد ] .

## پێشەکی

ئەی خوشکی شیرینم منێکی نامۆ لە شارو وڵاتەکەم دەربەدەر هاتوم ئامۆژگاریت بکەم ڕاستە من نامۆم وەتۆش نامۆی چونکە یەکتر ناناسین نازانم تۆ کێیت و وەتۆش نازانی من کێم بەڵام ئەوە ئەزانم هەردوکمان ئەهلی ئیمان تەوحیدین دەسا لە هەر شوێنێکی رەحمەتی الله تعالی-ت بەسەرا بڕێژێ حەزدەکەم گوێم بۆ بگری کە ئەم نامیلکەیە ئەخوێنیتەوە بەڕاستی من خەم خۆری ئێوەم کە ئیتر ساویلکەی ئافرەت بەس بێ بەس بێ کاریگەری ئەرێنی لەسەر دەرون بە جۆرێ توشی نەخۆشی نەفسی بیت یاخود خۆت بکوژی یاخوت بکوژرێی !!ئەزانی ئەمەوێ چیبڵێم ؟! ئەمەوێ ئەزمونی خۆمن پێ بڵێم لەو هەڵانەی کردومەو بیستومە بۆوەی تۆیەکی پاک بەهەڵەیەک پیست نەکەن چۆن پێشینان جوانیان وتوا ( هەڵە ئەبێتە پەڵە ) خوشکی سەنگینم ئێستا گوێم بۆ بگرە !!

**دروست نی یە بۆ ئافرەت پەیوەندی خۆشەویستی دامەرزێنێت لەگەڵ پیاوی نامەحرەم دا، هەرچەند نیەتی زەواجیانیش هەبێت:**

نامەیەک": ڕۆژێکیان من خەریکی مۆبایل بووم هێشتا باڵغ نەبوبوم منێک کەس ئاگادارم نەبوو چی بەو مۆبایلە ئەکەم چیم هەیە لەگەڵ کێیا قسە ئەکەم منێک لە سەردەمی جاهیلی بووم بەڵام تەمەنم مناڵ بوو ئەوەندە نەبووم تاوەکو بتوانم هیچ نەبێ لە شتێکی بچوکیش بگەم وە هاوڕێکانم هەموی دونیایی بون ڕۆژێک بەرنامەیەکیان بۆ دانام سەرەنجام دەستم کرد بە بڵاو کردنەوەی پۆست و شت ئیتر وردە وردە لێی ڕاهاتم ڕۆژێک منیان خستە لایڤێکەوە واتا بۆمنیان نارد منیش داخیل بووم دوای تەواو بوونی لایڤەکە یەکێ لە کوڕەکان نامەی نارد دەستی کردە قسەو پرسیار کردن ئیتر وردە وردە دەی دەی وتی خۆشم ئەوێی تەبعەن منیش تێنەدەگەشتم منداڵ بووم ئیتر دوای ڕەسمی منی کرد منیش بەو بچوکاتیەی خۆمەوە کەوتمە هەڵە ، وێنەکەم بۆی نارد دوای مودەیەک لەلایڤەکە بویە شەڕ ، یەکێ لەوێ بوو خەڵکی بەریتانیا بوو ، وتی ( تۆ بێدەنگ بە وێنەو شتی تۆم لایە زمانت بکەیتەوە ئەبێ وەکو سەگ بپارێیتەوە بۆوەی وێنەت بسڕم دوعا بکە بڵاوم نەکردۆتەوە " ) !! تێگەشتی هیچ لەمە ؟!

ئەتەوێ تێبگەیت ؟! کەوایە نابێ تێکەڵاوی کەسێ بکەی کەوا سوڕ ئەزانی نایناسی بۆۆ ؟ چۆن ساویلکەی بەدوو قسەی خۆش هەڵەخەڵەتێی ؟ هیچ بیرت کردۆتەوە ئایە ئەو گورگەی پێشتر ویستی مەڕەکان بخوات هەر لە پیستی مەڕ بوو ؟ ، ئەزانی پیاو زۆر فێڵ بازو نەفس نزمە ؟ ئەزانی

تەنها بەدوو قسە ئەتوانیٚ لە خشتەت ببات !! هەروەک الله تعالی دەفەرمووێت : ( الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاء) الآية 34

ئەم ئایەتەت وا لێک داوەتەوە تەنها ئەوەیە لە ڕوی جەستەوە پیاو بەهێزترن نا !! زۆر هەڵەی پیاو لەڕوی نەفسەوە ئەتوانیٚ ( دە ) ئافرەت بە جاریٚ لە خشتە ببات بەڵام بۆچی ئافرەت فەرقە تۆ ئەڵێی ئافرەت زاڵە بەسەر پیاوا ، ئەزانی ئافرەت لەچی زاڵە بەسەر پیاوا ؟ لە ( فیتنەدا ) چۆن فیتنەی ئافرەت بڵاوە ، جا خوشکی سەنگینم هاتم بڵێم کەتۆ شەخسیٚ نەناسیت زەمەنێکی ئەوێت تا سیقە پەیدا ئەکەی تۆ نازانی ئەمە پیاوە وەک ڕیسە وایە هەرکات بیەویٚ ئەبێتەوە خوری ( تۆیەکی عاقڵ و ژیر ئێستا چۆن باوەڕ ئەهێنی بە شەخسێک کە داوای وێنەت لێبکات ؟ ئەی گەر ڕاست بکاتە بیەویٚ بێتە داوات بۆ ئەڵێ پێش زەواج بت بینم ها !! مەگەر کاتیٚ هاتە ماڵتان نات بینیٚ ڕێگەی پێنەدراوە لە شەرع یان پیاوەکە ئەترسیٚ تا ئەوکاتە کوێر بیٚ ، ئەی هیچ بیرت کردۆتەوە لەوەی ڕەنگە ئەو کوڕە ئەو نیەتەی نەبیٚ لە مێشکی تۆیا ناترسی دوای ئەوەی ڕەسم و شتی پێت نارد پێت بڵیٚ بڵاوی ئەکەمەوە ؟ ناترسی داوای زیناو چونە دەرەوەت لێبکات ، ناترسی ئەو وێنەیەی ناردت دوای ئەوەی هەڕەشەی لێت کرد داوای ڕەسمی نیمچە ڕوتت لێبکات ، ها ؟ یەعنی بەجدی نەت بیستواو نەت دیوە سەرەتای نیوەی فیتنەیەک بە السلام علیک ورحمة الله وبرکاتە دەستی پێبکردوا خوشکی سەنگینم وریابە چی دەکەی دڵت پێش عەقڵە مەخە بۆ شتێک کە ئەتەویٚ بیکەی پرسیار لە شەخسێکی گەورە بکە بۆ ئەو بابەتە دڵنیابە ئەزموونی هەیە تۆیەکی ئافرەت ناکریٚ وابە ئاسانی دووچاری خۆ کوشتن بیتەوە بە مەبەستی هەڵەیەکی بچوک چونکە پێشوتر ئەزمونت لێی نەبووە !!

تێبگە خوشکی جوانم هیچ پیاوێ نایەوێ نامەردێ ببێتە مێردی خوشکەکەی مەگەر باوکی کچەکە خۆی ناپیاو بێ یاخود براکەی ئیتر براو باوکی تۆ پیاو بن ، بەڕای تۆ ئەهێڵن ئاوا بە نامەردی کوڕێک بێتە داوای کچەکەیان بۆ لە پێگەی باوک و برات ئەیەی ها !! ئەی نازانی چەندێ پێتەوە ماندوو بوە تا تۆی گەیاندوە بە ئێرە

نامەیەک ": ڕۆژێک شەڕێکم کرد لە گروپێک ڕۆشتم تا داوای لێبوردن بکەم دوای داوای لێبوردنەکەم کەوتمە چات کردن لەگەڵ ئەو نامەحرەمەیا چۆن ، ئەو شەوە تا بەیانیەکەی باسی خۆی بۆ ئەکردم منێکی ساویلکەش چیبێ باشە ، وردە وردە ژەهری خۆی پیا ڕێشتم تا توشی داوی بووم بەحیسابی خۆی خۆشی ئەویستم چەندی هێنام و بردم ئەموت وەرە داوام ئەیوت نا تا 3 ساڵی تر من ژن نایەنم ، ئیتر دەستم لێی هەڵگرت هەر کاتێ شەڕی بکردایە لەگەڵم ، بە وێنەکانم هەڕەشەی لێدەکردم ئەیوت بۆ فلان و فیساری ئەنێرم ئابڕوت ئەبەم " .

أفلا تتفكرون ؟! ئەرێ تێنافکرێن کەسێک تۆی خۆش بووێ ڕات ئەگرێ بە حەڕامی توشی زینای چاتت بکات ؟ کەسێ تۆیخۆش بووێ ڕائتەگرێ ، بڵێ تا سێ ساڵی تر ژن نایەنم ؟ ئەرێ کەسێ تۆی خۆش بووێ دەست بۆ شەرەفت ئەبا ؟ خۆ هەمو ئەوانە لەسەرتا هاتن مەڕ بون پاشان بونە گورگ کەس بە لێوی خۆی ناڵێ ماست ترشە !! بۆیە وریای خۆت بە لە ماڵەوە نازیان نەکێشاوی پێویست ناکات کوری خەڵکی نازت بکێشێ مادام لە ماڵەوە قابیل نەبویتە بۆوەی توشی هەڵە نەبیت دڵنیابە لە دەرەوە دە ئەوەندە قابیلی نیت پێویستت بە ناز کێشان نیە ئەوەی هەستا بڵێ خۆشم ئەوێی دێمە داوات ، ئەمرم بۆت داوای تۆ حەڕامە لەمن !! باوڕی پێبکەیت نانا خۆشەویستی ئەوە نیە

وه هەروەها پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی : ( **أَلا ، لا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ** ) صحيح الترمذي (2165)

واتە : ئاگادار بن ، هیچ پیاوێک لەگەڵ ئافرەتێکدا لەجێگەیەکدا کۆ نابنەوە ئیلا شەیتان سێ یەمیانە

وە تێبینیەکی بچوکیش : هەر کاتێ پیاو دەستی کرد بە مەتعی خۆی ئەوا بزانە کوڕێکی درۆزن و فاشیلە نەخۆی پێوە بەڕێوە ئەچێ نە عەقڵە نە تۆش خۆت بە سەلامەتی ئەدۆزیتەوە لەژێر دەستی

تۆیەکی ئافرەت هەرگیز نابێ هەڵبخەڵەتێی بە قسە قێزەونەکانی شەخسەکان تەنها سەیری عەمەلیان بکە بزانە ئەو بەعرەی باسی ئەکات عەمەلەکەی پەرداغێکی لێ پڕ ئەکات !! بە دڵنیاییەوە نەخێر

جا ئەمەوێ بڵێم هەر شەخسەو بە نیەتێ دێت هەیانە بە نیەتی ئەوە یەت جەوی خۆیت لەگەڵ بەسەر بەرێ کە تەواو بوو ئاوڕیشت لێناياتەوە ، نەتان بیستوەو نەتان دیوە جاروایە بە ضاهر لە چات کەسی موسڵمان باش بووە بەڵام وایە ؟ هەشە بەنیەتی ئەوە یەت ببێتە هاوڕێت و پاشان خۆشەویست و پاشان عیشق و إلی آخير ئەزانی بۆ چونکە چاوی لە ناموسی خوشکو دایکی نەبوە ڕێزو حورمەتی ئەوانی نەگرتوا وائەزانی گەر گوتی قوربانت بم خۆشم دەوێی بێ تۆ ناژیم !! ئیتر تەواو ڕاستی کرد نا دوبارە ئەڵێم هەڵەی ئەوەی خۆشی بوێیت قەت شتێ ناکا الله پێی ناخۆش بێ تۆ هۆگری خۆی ناکا تا توشی شیرکی خۆشەویستی بی

نامەیەک ”: ڕۆژێک کوڕێکم زۆر خۆشویست ڕاستە ئەخلاق و ڕەوشتی هەبوو زۆریش کەسێکی باش بوو بەڵام ئەزانی چی سەیرەکە لە کوێ دایە ، دوای ئەوەی بەڵێنی زەواجی یابو بینم لەگەڵ کچێکی ترە و چۆتە داوای ئەو !! ئەمە چی پێ ئەوترێ بە عەقڵی ئێوە دوای ئەوە زۆر زۆر ئازارم چەشت چۆن ! هۆگری بوبوم داڕوخابووم بەجارێ هەرجارێک یەعنی بەجارێ گۆشەگیر بوبوم گوێم لێ نەئەبوو دەستم بچێتە کوشتنی خۆشم لە مینای ئەوەی بە حەڕامی دڵم بۆ غەیری الله تعالی چو وە پرسیاریان لێم کردایە جوابم نەئەیایەوە تەنانەت ماڵەوەش نەیان دەزانی کێشەکەم چیە دوای ئەوەی الله تعالی دڵی پاک کردمەوە ، ئەزانی بۆ وای لێهات چوە لای کچێکی تر چۆن ساویلکەیی بەحەدێک عەقڵ لە ئافرەت ئەبڕێت “

تاکەی هۆشت نایەتەوە ئەمانە ڕاستگۆ نین لە گەڵ خۆیان چجای ئێوە ؟

کەسێ بیەوێ بێتە داوات لە دەرگای دڵت ئەیات یاخود دەرگای ماڵەوەتان یەک تۆز بیر کەیتەوە تێدەگەیت ، سەیری ئەم نمونەیە بکەن ئافرەتی ژیر ئەبێ ئاوا بێت

ووتی: ژمارەی تەلەفۆنەکەتم بدەرێ با یەکتر بناسین بۆ زەواج..! ووتی : ٢-٢٩-١٨٩..!! ووتی ئەو ژمارەیە سەیرە..!وتی بڕۆ مصحەفەکەت بکەوە لە سورەتی دووەم (البقرة) لاپەڕە ٢٩ ئایەتی ١٨٩ نوسراوە: **وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا ۚ**

واتە: لەدەرگاکانەوە بچن بۆ ماڵەکان ... !

خوشکانی من ڕێگا مەدەن تەنانەت کەسانی_پاکیش ! لە جگە لە دەرگاوە بێنەماڵتان..!

نامەیەک" : ئەڵێ زۆرم خۆش ویست هۆگری بووم زیاتر لەخۆم خۆشم ئەویست دوای مودەیەک هات و وتی من کچێ ترم لە دڵە !! "

هێشتا تێنەگەشتی وەرە تێت ببگەیەنم ئەزانی بۆ الله تعالی بە پیاو ئەفەرموێ چوار ژن حەڵاڵە !! چۆن دڵی پیاو وایە پڕە لە تەماع هەر ئەوەشە وای کردوا چواریان بۆ حەڵاڵ بێ... ئیستاش لەچاتی خۆشەویستی حەرام بەردەوام دەبێت ! ،وە چاوڕی بەڵێنی درۆینی ئەو دەبێت کە دوای دوو بۆ ٣...ساڵ بێتە داوات لە کاتی دڵی پیاو بەردەوام لە گۆڕانە .

خوشکی شرینم سوێند بە الله کەسێ بیەوێ بێتە داوات داوای ڕەسمی تۆ ناکات چۆن ئەزانێ لە شەرعا دوای ئەوەی هاتە ماڵتان ئەت بینێ گە تۆی بەدڵ نەبێ ئەتوانێ ڕەفزت بکاتەوە وەللەهی ئەوەی بە حەڕامی قسەی نەشیاوت لەگەڵ بکات تۆی ناوێ ئەوەی هەرچەندە موسڵمانە بەڵام داوای وێنەی ڕووت لێبکات ئەوەی هەر چەندە موسڵمانە داوای تێلت لێبکات و کاتەکانیت لەگەڵ بگۆڕێتەوە ، وەللەهی خەمی دینەکەتمە وەللەهی خەمی حەیاو ناموسی خوشکێکی موسڵمانم کە گورگەکان چاویان لەدوایە ، کام پیاو ئەیەوێ ڕەسمی ڕوت بە خوشکەکەی بنێرن پاشان بڵێ دێمە داوات ؟! وەللەهی ئەو کوڕەی ئەو ڕەسمەت پێ دەنێرێ لە ئەخلاقیا نیە بهێڵێ ئاوا لەگەڵ خوشکی بکرێ !! بۆیە بەسە خوشکم ساویلکە مەبە بۆ زەرەر لە نەفسی خۆت ئەدەی اللهش لەخۆت دەڕەنجێنی ، ئەی تۆ هۆشت هەیە دو بۆ سێ ساڵە لەگەڵ کوڕێکی بەناوی خۆشەویستی ئەوە خۆشەویستی نیە ئەمە پێی دەڵێن خۆ هەڵخەڵەتاندن **خۆشەویستی لە پێش زەواجا جێگای نابێتەوە** ، چۆن ئەو زەواجە بکرێ و نەکرێ هیچ خێرو بەرەکەتێکی تیانیە زۆرمان بینی لەو پەڕی عیشق و غرامیات بوون دوای

ئەوەی زەواجیان کرد تێلیان بۆ مامۆستا کردوا وتویەتی بگە فریام ئەو ئافرەتەم لەکۆڵ کەنەوە وەڵڵەهی چەندێ پارەی لە هێنانەکەی خەرج کردوا دو ئەوەندەش لە تەڵاقەکەی ؟ ئەزانی بۆ الله بەرەکەت ناخاتە حەرامەوە یەکێ تریش لەوانە بریتیە لە عیشق ئەوە پیسترین جۆری بەناو خۆشەویستیە کە پێی دەڵێن خۆ هەڵخەڵەتاندن ( دوای ئەوەی هۆگری ئەبی بەتەواوەتی یان جێت دەهێڵێ یان خیانەتت لێدەکات چۆن نەفسی پیاو وایە ؟ کێ زەرەری کرد ئەو یان تۆ ؟! خۆت هێناو بردو ئەوەندە خەمەت یا بەخۆت خۆت توشی نەخۆشی نەفسی کرد یان چی توشی گۆشەگیری بووی یان جنێکت چوە لاشەی عاشقت بوو ، ئەزانی هۆکار چی بوو هۆکار ئەوە بوو دڵت بۆ غەیری الله تعالی ڕۆشت کاتێ مەلابانگی ئەیا بەیەکەوە قسەتان ئەکرد گوێتان بە بانگکردنی الله تعالی نەئەیا ئەوەش هی ئەوە بوو تەقوا لە دڵتا نەبوو ) . وە جوانترین شت دەربارەی عیشق وترابێ بریتیە لەوەی کە رسول الله ﷺ فەرمووی : ئەی خەدیجە رضی الله عنهم من هەژار بووم الله بەتۆ دەوڵەمەندی کردم دەسا تێبگە **عیشق و خۆشەویستی دوای زەواجە زەواجـــ** بۆخۆت ئەخەیتە هیلاکیەوە کە باش ئەزانی هەندێ جار دووچاری مەرگت ئەکاتە ، جاری وایە ئەو کوڕە دێتەماڵێتان و دێتە داوات ئەبینی ماڵەوەتان ڕازی نین چی ئەمێننەوە یان زەڕبە بەر تۆیەکی ساویلکە ئەکەوێ دەست بۆ کوشتنی خۆت ئەبەی یان ئەو کوڕە زەڕبە لەخۆی ئەیا خۆی ئەخاتە جەهەنەمەوە ئایا کام ویژدان ئەوە قبوڵ ئەکات کەسێک لەبەر تۆ بخرێتە ئاگری جەهەنەوە تۆش سەیرکەی و هیچت بۆ نەکرێ !!

عشق و دڵداری جۆرێکە لە ئازارو سزا کەسی عاقڵ ئازارو سزا بۆ خۆی هەڵنابژێری خۆی ئازار نادات. روضة المحبين ونزهة المشتا قين(١/١٤٣)

## چی بکەم بۆ ڕزگار بوون لە دەردەی عاشق خۆشەویستی:

**شیخ الاسلام ابن قیم** ڕەحمەتی الله لێ بێت دەفەرمووێت : (( ئەگەر عاشق هیچ ڕێگای نەبوو بۆ ئەوەی بگات بە خۆشەویستەکەی لە ڕووی شەرع و قەدەرەوە ، ڕێگری هەبوو لەم دوو ڕووەوە ئەوا چارەسەر ئەمانەن :

**یەکەم** : دەرمان ئەوەیە خۆی لێ داببڕێت و چارەسەری ئەوەیە نەفسی خۆی لێ بێ ئومێد بکات ، چونکە نەفس کەی بێ ئومێد بوو لە شتێک ئیسراحەت دەکات و ئاوڕی لێ نادەتەوە .

**دووەم** : ئەگەر نەخۆشی عیشق بەردەوام بوو لەگەڵ بێ ئومێد بوون ، ئەوا سروشتی تووشی لادانێکی توند بووە ، دەبێت نقل بێت بۆ چارەسەرێکی تر ئەویش چارەسەری عەقلە ، ئەویش ئەوەیە بزانێت دڵ پەیوەست بوون بە شتێک کە هیچ ئومێد نییە بۆ بەدەست هێنانی جۆرێکە لە شێتی ، خاوەنەکەی وەک ئەوە وایە کە عاشقی خۆر بووبێت ، ڕوحەکەی پەیوەستە بە بەرزی و بەدەوری خولانەوەی ، ئەمەیان دیارە لای خاوەم عەقلەکان و ژیرەکان کە ئەمە لە کۆمەڵەی شێتەکانە .

**سێیەم** : ئەگەر نەفسی تۆ ئەم دەرمانەشی قبول نەکرد ، ئەوا بیر لە خراپە و شتە ناشرینەکانی خۆشەویستەکەت بکەوە ، وە ئەو شتانەی وات لێ دەکات لێت دوور بخاتەوە ، چونکە ئەگەر داوای بکەی و لێی ورد ببیتەوە هەست بە چەندین شتی باش و جوانی دەکەیت ، پرسیاش لە دراوسێی بکە لەوەی شاراوەیە ، چونکە شتی باش و جوانی ئافرەت ڕات دەکێشیت بۆ خۆش ویستنی و داوا کردنی ، وە شتی خراپ و ناشرینی دوورت دەخاتەوە لێی ، .....

**چوارەم** : ئەگەر هیچ لەم دەرمانانە چارەسەر نەبوون ئەوا تۆ هیچت نەماوە ئیلا گەڕانەوەیەکی ڕاست بۆ لای ئەوەی کە بە هانای تەنگانە و لێ قەماوەوە دێت ، نەفسی خۆت بخە بەردەم الله تعالی و لە دڵەوە دوعای لێ بکەو خۆتی بۆ زەلیل بکە .

**"زاد المعاد لابن قيم " (251/4)**

## چەند ئامۆژگاری بۆ ئافرەتان :

ئایە ئەزانی تەوقەکردن و نەزەر کردنی چ ئافرەت بۆ پیاو بێ چ پیاو بۆ ئافرەت بێ تەماع دروست دەکات چۆن ؟ بە سەیر کردون هەر تێرامانێکی مرۆڤ بۆ سەیر کردنی بەرامبەری هەستێک دروست دەکات هەندێ جار بەنیەتی شەهەوەت هەندێ جاریش بەناوی خۆشەویستی ( خۆ هەڵخەڵەتاندن ) بۆی خوشکی سەنگینم وریای چاوەکانت بە مەهێڵە دڵت نەخۆش کەوێ تەقوای الله بکە لە هەر شوێن و جێگایەک و کاتێک بوی چونکە بەڕاستی هەندێ نەزەر هەن زینای بەدواوەیە واوەیلا بۆ تۆ ئەی خوشکەکەم گەر نەفست فێڵت لێبکات توشی زینات بکات

بەڵگەی حەرامیەتی خۆ دانەپۆشینی ئافرەت و دەربڕین جوانی لەبەر چاوی پیاوانی نامەحەڕەمدا ، ئەو فەرموودەیەیە کە ئیمامی مسلم (2128) لە

(أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە ودەڵێت : پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی : صِنْفَانِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ لَمْ أَرَهُمَا : قَوْمٌ مَعَهُمْ سِيَاطٌ كَأَذْنَابِ الْبَقَرِ يَضْرِبُونَ بِهَا النَّاسَ ، وَنِسَاءٌ كَاسِيَاتٌ عَارِيَاتٌ مُمِيلَاتٌ مَائِلاتٌ رُءُوسُهُنَّ كَأَسْنِمَةِ الْبُخْتِ الْمَائِلَةِ ، لا يَدْخُلْنَ الْجَنَّةَ ، وَلا يَجِدْنَ رِيحَهَا ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ كَذَا وَكَذَا ) .

واتە : دوو کۆمەڵ هەن لە ئەهلی دۆزەخ نەمبینیوون.

کۆمەڵێکیان قامچیان پێیە وەکو کلکی مانگا وایە پێی لەخەڵکی دەدەن کۆمەڵێکیان ئافرەتانێکنن داپۆشراون بەناو بەڵام لە ڕاستیدا ڕووتن ، بەلەنجە و لار دەڕۆنە ڕێوە ، و سەرنجی پیاوان بۆ خۆیان ڕادەکێشن ، و پرچیان بە شێوەیەک بە سەر سەریانەوە دەبەستن وەکو بان پشتی ووشتر

وایە، ئەوانە ناچنە بەهەشت وبۆنیشی ناکەن ، لە کاتێکدا بۆنی بەهەشت ئەوەندە ئەوەندە دەڕوات .

بەڵگەی حەڕامیەتی تەماشا کردنی پیاو بۆ ئافرەت ئەم ئایەتە پیرۆزەیە :

( قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ) النور/30 .

واتە : ئەی محمد - ﷺ - بە پیاوانی باوەڕداران بڵێ : با چاوی خۆیان بپارێزن لە تێڕوانینیحەرام (چونکە زینای چاو بریتییە لە تێڕوانینی حەرام) وە دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا . وە هەروەها سەبارەت بە ئافرەتانیش دەفەرموێ : [وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ] وە ئەی محمد - ﷺ - بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ : با چاوی خۆیان بپۆشن لە تێڕوانینی پیاوانی نامەحرەم ، وە با دامێنی خۆیان بپارێزن لە زینا

[وە ئیمامی مسلم (2159) لە جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه گێڕاویەتیەوە ودەڵێت : سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ نَظَرِ الْفُجَاءَةِ فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي ].

واتە : پرسیارم کرد لەپێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەبارەی تەماشا کردنی لەناکاوەوە و فەرمانی پێکردم یەکسەر چاوم وەرگێڕم

جا ( تەماشا کردنی لەناکاو ) ئەو تەماشا کردنەیە کە چاوت بەئافرەتێک بکەوێت بەبێ مەبەست ، هەروەک ئەوەی بەڕێگایەکدا تێپەڕ ببیت وچاوت بە ئافرەتێک بکەوێت .

## دەرچوونی ئافرەت بەبۆن خۆشی:

ئەی خوشکی سەنگینم هەرگیز نەکەی بۆنی خۆش لەخۆت بدەی لەکاتی دەرچوون بەڕاستی ئەمەش هۆکارێکە بۆ لەدەست دانی حەیاو حیشمەتت ئەم بابەتانە گەلێ جدین بەڕاستی لەسەرت واجبە بە گوێمان بکەی پێش ئەوەی کار لە کارا بترازێ و تەنها شەرمەزاری بۆخۆت و عایلەکەت جێ بمێنی وە لە قیامەتیشا بە هەندێ تاوان بسوتێی کە ئەسڵەن مەیلی دڵت بۆی نەچوا نەت زانیوە تاوانە وە دەبێتە خەڵوەت بۆ پیاوی نامەحرەم تەماح زیاد دەکا بە جۆرێ سەرەنجی ڕا ئەکێشێ ئایە هیچ هەنگێتان دیوە بچێتە لای گوڵێکی بۆن ناخۆش و شیلەی خۆی بڕێژێ ؟ بە دڵنیایەوە نەخێر دەسا تێبگە پیاوانیش هەمیشە بەدوای شتانی بۆن خۆشەوەن جچای تۆیەکی ئافرەت کە لە گوڵ ناسکتری کە بۆنت یا لەخۆت ئەو پیاوە هەرچەندە خاوەن خێزان بێ هەرچەندە لە پەیوەندی درۆینەی خۆشەویستیا بێ ئیلا بۆنت ئەکات چونکە دڵی نەخۆشە مەگەر کەسانێک نەبێ الله تعالی دڵی پڕکردبن بە نوری تەقوا سەریان نزمە نوێنن لە ئاساتانا تۆش جگە لەوەی بە زینا بۆت حیسابە هیچی ترت بۆ نامێنێتەوە ئای چەندێ شەمەزاریە دەستت بەر نامەحرەمیش نەکەوتێبێ الله تعالی بە زیناکار ناوی بردبی و مەلائیکەتەکان لەعنەتت لێبکەن و پیاوی خەڵکیش توشی زینا بکەی ئەی چی گەر زینای لاشەی لێکەوتەوە

بەڵگەی حەڕامیەتی دەرچوونی ئافرەت بەبۆن خۆشی بەشێوەیەک پیاوان بۆنی بکەن ، ئەو فەرمودەیەیی پێغەمبەرە ﷺ : ( أَيُّمَا امْرَأَةٍ اسْتَعْطَرَتْ فَمَرَّتْ عَلَى قَوْمٍ لِيَجِدُوا مِنْ رِيحِهَا فَهِيَ زَانِيَةٌ ) رواه النسائي (5126) وأبو داود (4173) والترمذي (2786) واتە : هەر ئافرەتێک بەبۆن خۆش کراوی لەماڵ دەربچێت وبەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕێت بۆ ئەوەی بۆنی بکەن ئەوا ئەو ئافرەتە وەک ئەوە وایە زینای کردبێت

## نەكەێت دەنگەت بۆ نامەحرەم ناسك كەیتەوە :

ئەی خوشكەكەم نیشانەیەكیش كەوا وات لێدەكات مەغرور بی لە ترسان لە الله تعالى بریتیە لەوەی دەنگت بۆ نامەحرەم ناسك كەیتەوە چۆن ؟! تۆیەكی موسڵمان مۆحید زەربە ئەدەی لە دڵی برا مسوڵمانەكەت ئایە نەت دیوا مامۆستای وا هەیە دڵی نەخۆش كەوتوا دڵی پڕبوە لە تەماح بەجۆرێ نەفسی بەسەر خۆیدا زاڵ كردوا دوای ئەوەی تۆیەكی تاوانبار دەست دەكەی بە تیلكردن بۆ كردنی پرسیارێك ئا لێرەدا شەیتان فێڵت لێدەكات دەنگت ناسك دەكەیەوە بەڕاستی ئەگەر پیاو لە پەڕی ڕەقایەتی پێت نەرم ئەبێتەوە لێت ڕەنگە هەر لەگەڵ بونی پەیوەندییەكە هەرچەندە موسڵمانی دینداریش بێ داوای كاری خراپەت لێبكات تۆش ئەوكاتە بە دوو قسەی خۆش تەسلیم ئەبیت ئەوجا شەیتان فێڵتان لێدەكاو دەكەونە داوەكەوە یان ئەوەتا بەردەوامی پێ دەدەن لەسەر ئەو تاوان و بەد ڕەوشتیەتان یان ئەوەتا تەوبەی لێدەكەن سەرتا نزم دەبێ شەرم لە خۆتانا دەگەنەوە لە هەر مەجلیس و جێگایەك باسی زینای تیابكرێ بۆیە وریای خۆت بە نەكەی دەنگت ناسك كەیتەوە لە هیچ شوێنێكا بۆ بێگانە ئەگەر چی لەنێو عەرمی مەكەشا بووی دڵنیابە زەربە لەخۆت ئەیەی والله اعلم بالصواب

**بەڵگەی حەڕامیەتی دەنگ ناسك كردنەوەی ئافرەتان ، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە : ( يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلاً مَعْرُوفاً ) الأحزاب/32 ،**

واتە : ئەی خێزانەكانی پێغەمبەری الله - ﷺ - ئێوە وەكو هیچ لە ئافرەتانی تر نین ئەگەر تەقوای الله تعالى بكەن ، واتە: پلەو پایەو فەزڵ و ئەجرو

پاداشتان یەكجار زۆرە [فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ] وە نابێت كاتێك كە لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا قسەتان كرد بە نەرمی و ناسكی قسە بكەن [فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ] ئەو كاتە كەسێك كە نەخۆشی نیفاق یان نەخۆشی شەهەوات و ئارەزوو لە دڵیدا بێ لەوانەیە تەماح بكات [وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا (32)] وە كاتێك كە لەگەڵ پیاوانی بێگانەو نامەحرەمدا قسەتان كرد قسەی جوان بكەن با قسەكانتان دوور بێت لە نەرمی و ناسكی و گومانەوەو وەكو پیاوی خۆتان قسەیان لەگەڵ مەكەن .

جا ئەمە گەر بۆ دایكی باوەڕداران وابێت ئەوا بۆ جگە لەوان زۆر لەپێش ترە .

## پەیوەندی خۆشەویستی پێش زەواج

وە باش بزانە کە زۆربەی موسیبەتەکان سەرەتا بەهەندێ شتی سادە دەست پێ دەکات ، پاشان شتانێک ڕوو دەدەن کە هەرگیز بیریان لێنەکراوەتەوە ، هەر بۆیە الله لە قورئانی پیرۆزدا کاتێک باسی زینا وداوێن پیسی دەکات

دەفەرموێ : [وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً] [سورة الإسراء: (32) ] .

واتە: نزیکی زینا مەبنەوە چونکە زیناکردن کارێکی زۆر ناشیرینە و ڕێگایەکی خراپە.

تەماشاکە نەک نابێ زینا بکەوی بەڵکو فەرمانت پێ دەکات کە نزیکی زیناش نەبیتەوە ، بێ گومان نزیک بوونەوەش لە زینا سەرەتاکەی بە پەیوەندی ناشەرعی و قسە کردن و یەکتربینین ڕوو دەدات .

وە زۆر ئافرەت هەبوون زۆر سیقەیان بەخۆیان هەبوو ، وباوەڕی وا بوو ئەو گەنجە هیچی.ی لێناکات ، بەڵام سەرەنجامەکەی ئەوەبوو هەموو شتێکی لەدەس دا ! پاشان ئەو گەنجە وازی لەو کچە هێنا کەپێشتر پەیمانی زەواج کردنی پێ دەدا ، چونکە ئێستا بۆ ئەو ناگونجێت ، ئایا چۆن سیقەی پێ دەکات لەکاتێکدا ڕێگەی داوە بچێتە لای وپەیوەندی لەگەڵ کەسێکی نامەحەڕەم دا ببەستێت .

جا ئێمە کاتێ ئەم شتانەت پێ دەڵێین ، وەک ئامۆژگاریەک پێیتی دەڵێین وخێرمان بۆ تۆ دەوێت ، دواکارین الله لەهەموو ناخۆشیەک وخراپەیەک بت پارێزێت .

خوشکی سەنگینم لەوانەیە ئەوەم نە پێکابێ کە لە خەیاڵما دەمەویست بەڵام هیوام وایە لە مەبەستم تێگەشتبی هەندێکیم کردە ڕونکردنەوەو بەشێکیش باسی هەڵەکان سەرەنجام و کۆتایی بە نامیلکەکە دەهێنین بەڵام کۆتایەکی جوانتان بۆ جێدەهێڵم ئەویش ...

نامەیەک " : ڕۆژێک شەخسێکم ناسی داوای زەواجی کرد ئیتر منیش ڕازی بوو بەڵام ئەو وتی لەسەرمان قورسە بەڵام دەزانی جوانترین شتی ئەو کوڕە چی بوو ؟ وتی منێک گەر بێم چاتت لەگەڵا بکەم بت هێڵمەوەو هۆگری خۆمت بکەم دواتر نەتوانم بت هێنم ئەی چی لە قیامەتم بکەم ، منێک سنوری الله تعالی بشکێنم بێم بە حەڕامی چاتت لەگەڵا بکەم ڕاستە خۆشم دەوێی بەس خۆشەویستم ئەوە ناگەیەنێ بۆت تۆ پێش الله تعالی بخەم چۆن ئەزانم لەسەر قورسە گەر ئاسانیش بوایە دڵنیابە ئارەزوی قسەکردنم نەبوو لەگەڵت بە حەڕامی من ڕەسمم لێت ناوێ چۆن من لەدوای جوانی ئافرەتەوە نیم ، من ئەسڵەن تا ئێسا ڕەسمی ئافرەتم هەر نەدیوە چۆن ئافرەت فیتنەیە بۆیە لە پێناو ئەو الله تعالی یە با واز بهێنین لە چاتی حەڕام هەم منیش و هەم تۆش دڵمان نەخۆش ناکەوێ بەر سزای الله ناکەوین ئێوە دوعا بکەن منیش دووعا ئەکەم گەر خێری تیایە الله بۆمانی پێش بهێنێ گەر خێریشی تیانیە الله باشترت بکاتە قسمەت ! ئەمەش پێیەوترێ پیاوەتی نەوەک خۆ دزینەوە !! " .

ئەم پیاوانە زۆر دەگمەنن الله اعلم جا وریای خۆتان بن

**له کۆتایه:**

**پێغەمبەری الله ﷺ فەرموویەتی :** ( كُلُّ ابْنِ آدَمَ خَطَّاءٌ ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ) صحيح الترمذي (2499) .

واته:- هەموو مرۆڤێک توشی هەڵە دەبێت وباشترینی هەڵەکارانیش ئەوانەن کەتەوبە دەکەن .

هیوام وایە دوای ئەو نامیلکەیە تەوبەیەکی نەسوعی لەسەر بکەن و نەگەڕێنەوە سەر ئەوکارە ئەوەشی توشی نەبوە بازیاتر هانی خۆی بدات نەبا فیتنەکە ئەویش بە لاڕێدا ببات خۆشم ئەوێن لە پێناو الله تعالی ئەی ئەوەی ئەو نامیلکەیە دەخوێنێتەوە

وصلی الله علی محمد وعلی إل وصحبی أجمعین